# کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی

## کەشکۆڵی عەبدولفەتاح

لێکۆڵینەوەی

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

بەرگی پێنجەم

ناوی کتێب: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی - کەشکۆڵی عەبدولفەتاح - بەرگی پێنجەم
لێکۆڵینەوەی: محەمەد عەلی قەرەداغی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٤١
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: شکار شێخ عەفان نەقشبەندی
خۆشنووسیی بەرگ: هونەرمەند محەمەد زادە
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٣٩)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

# پێشەکی

نزیکەی ( ١٠ ) ساڵە لە دوای دەرچوونی بەرگی چوارەمی (کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی)یەوە، لەم پرۆژە - پرۆژەی کەشکۆڵ بڵاوکردنەوە - دابڕاوم، هەرچەند لەم ماوەدا، بەزۆریی، سەرگەرمی کارگەلێک بووم لە جوغزی ئەم پرۆژە بەدوور نین و، بەڵکو بەشێکی کارەکانم دۆزینەوەی کەشکۆڵ و ناساندنیان بەمێژووی ئەدەبی کوردیی بووە و[١]، ئەوەیش لەم رووەوە ئەنجامم داوە خۆشبەختانە بەشانازییەوە دەڵێم: کەس پێش من نەیکردووە و پەیی پێنەبردووە. هەر ئەمەیش بوو لەم ماوەدا هانی دام بۆ ماوەیەک بگەڕێمەوە سەر ئەم رێبازە و بەرگی پێنجەمی ئەم پرۆژە بخەمە بەردەستی خوێنەرانی کورد، چونکە لەم ماوەدا -وەک گوتم- کەشکۆڵگەلێکی زۆرم دیون و، هەلی ئەوەم بۆ رەخساوە وێنە و فۆتۆکۆپیی لە هەندێکیان وەربگرم و، کەرەستەی باشی بابەتەکەم چنگ بکەوێت.

## ئەم کارە بۆ؟

هەرچەند چوار بەرگەکەی پێشووی ئەم کەشکۆڵە لە کتێبخانەی کوردییدا جێگەی دیاریی خۆیان گرتووە و، شەیدایانی ئەم بوارە بەنرخەوە دەیانڕواننێ، تا ئێستە ئەو کەشکۆڵانە بوونەتە سەرچاوەی گەلێ کاری بەپێزی لێکۆڵینەوە و بووژاندنەوەی سامانی کەلەپووریمان و، لەوانەیشە لەمەولایش زیاتر بایەخیان پێبدرێت و، رەنگە تا ماوەیەکی دووریش ئەم بایەخە هەر لە برەودا بێت... ئەو چوار بەرگەی کەشکۆڵ هەموو شتێک نین و، کاری کۆکردنەوەی بەرهەمی شاعیرانی کورد بەمەندە تەواو نابێت و، بۆ گەلێک کە سامانی کەلەپووریی و نەتەوایەتیی هەمیشە لەناوبرابێت و، بەری هەست و بیری رۆشنبیرانی هەر خۆراکی ئاگری کینە و رقی دوژمنانی بووبێت و، ئەوەی لەو تەنووری رقە قوتار بووبێت، دەبێ کاری تایبەتی و چەند سەرەی بۆ بکرێت، تا ئەو قوتاربووانەیش بەدەردی ئەوانی پێشوو نەچن و، بەهۆی خەم

(١) گومان لەوەدا نییە ئەوەی دەربارەی مێژووی ئەدەبی کوردیی نووسراوە مێژووی تەواوی ئەدەبی کوردیی ناگرێتەوە و، گەلێ لایەن هەیە یان پێویستیان بەوەیە زیاتریان لەسەر بنووسرێت، یان هەر هیچیان بۆ نەکراوە. چەند جاریش ئەوەم نووسیوە کە هەرگیز ناتوانین قەوارە و ئەندازەی زیانگەلێک دەستنیشان بکەین کە لە سامانی کەلەپووریمان کەوتووە، هەروەها تا ئێستەیش نەمانتوانیوە بزانین چیمان لە چنگی نەهەنگی لەناوبردن و لەناوچوون رزگاربووە و لەکوێن و لە چ بارودۆخێکدان و، ئەگەر بیشتوانین ئەم کارە بکەین رەنگە هێشتا زۆری بەبەرەوە مابێت و ماوەیەکی باشی بوێت تا بتوانین بکەوینە سەروسۆراخی شوێنەوارەکانمان لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا.
لەم بوارەیشدا هەرچیم گوتووە و نووسیوە قسەی رووتی بێ بەڵگە نەبووە و، هەموو جارێک لە بەڵگەیەک زیاترم لەسەر ئەو بابەتە هێناوەتەوە کە لێی دواوم. ئەم جارەیش بەڵگەیەکی رەق و دیاری ئەوە دێنمەوە کە لەوانەیە هێشتا گەلێ شتی پڕ بایەخی دوورەدەستمان مابێت کە خۆمان خەمیانمان نەخواردووە و، خەڵکیش یان هەر پێیان نەزانیوون یا لەبەر کاری خۆیان سەر ئێمەیان نەپەرژاوە.



نەخۆریی رۆشنبیرانەوە، لەکاتێکدا کە لە توانادایە ببووژێنرێنەوە پشتگوێ بخرێن و، ئەم زیانانەیش سەرباری ئەوانی دی بن.

ئەم ئەرکەیش کاری یەک کەس و تاقە زەلام نییە و، دەبێ هەمەگیریی و گشتگیریی بێت و، هەموو پسپۆڕان و شارەزایانی ئەم بوارە خۆیان لە عاستی ئەم سامانەدا بەبەرپرس بزانن و، هەرکەس هەرچی پێدەکرێت دریغی نەکات و، چاوەڕوانی ئەوە نەبێت، لە باتیی ئەو، کەسانی دیکە کارەکە بکەن، چونکە دەبێ بزانین گەل بەزمانەوەیە و، گەلی بێ زمان گەل نییە و، درەنگ بێت یان زوو هاوگەلەی گەلانی دی دەبێت و ناوی کوێر دەبێتەوە!

گەلی کورد کە لەم چەرخەدا رووبەڕووی ئەرکی قورس و قەبەبووەتەوە تا گیان و کیانی خۆی بپارێزێت و، وردە وردە لە گاوڵکێدایە و، دەیەوێ بکەوێتە سەرپێ و خۆی لەسەرپێیی خۆی بگرێت، لە هەموو کات زیاتر پێویستیی بەوەیە زمانێکی دەوڵەمەند و رەسا و پڕ دەستەواژەی هەبێت و، بەو زمانەوە هەنگاو بنێت و بەرەو کۆڕ و کۆمەڵی گەلانی جیهان بچێت.

ئەم زمانەیش بەوە دەستەبەر نابێت کە هەرکەس لە گوێ ئاگردانی ماڵی خۆیدا چی لە باوک و دایکیەوە فێربووە - تەنها - بەوە بدوێت و بنووسێت و بخوێنێتەوە، بەڵکو تەجرەبەی گەورە رۆشنبیرانی جیهان و زانا و ناودارانیان وامان پیشان دەدات کە رۆشنبیری لێهاتوو پێش هەموو شتێک پێویستیی بەزمانێکی دەوڵەمەند هەیە تا بتوانێ لە رێگەی ئەو زمانەوە وەک شیاوە و وەک دەیەوێ مەبەست و ئامانجی بەخوێنەری باس و بابەتەکانی بگەیەنێت.

بۆ نموونە رۆشنبیر و زانایانی عەرەب موعەللەقاتی سەبعە و، دیوانی موتەنەبیی و، مەقاماتی حەریریی و، چەندین شاکاری لەو چەشنانەیان خوێندووە و لەبەرکردووە.

ڕۆشنبیرانی فارسیش چەندین شاکاری وەک: مەثنەوی و، فیردەوسی و، خەمسەی نیظامیی گەنجەویی و، دیوانی حافظ و، سەعدیی و، کەلیم و... کێ و کێیان خوێندووە و لەبەرکردووە، ئەوسا بەزمانێکی تێروتەسەل و لەبارەوە هەنگاویان بەرەو کۆڕی ئەدەب و رۆشنبیریی ناوە.

دیارە ئەمە بۆ گەلانی خاوەن زمانی زیندووی دیکەیش پەیڕەویی کراوە و دەکرێ و کێیش بیەوێ ببێ بەڕۆشنبیر و خاوەنی قەڵەمی بەبڕشت دەبێ لەپێشدا زمانەکەی مشتوماڵ و سفتوسۆڵ و لەبار بکات.

ئایا ئەم خۆتەیارکردنە بەچەکی زمانی رەسا پێش چوونە ناو گۆڕەپانی ئەدەب و رۆشنبیریی، رۆشنبیرانی کورد ناگرێتەوە؟ بێگومان و راوەستان و سڵەمینەوە دەڵێین: بەڵێ.

جا ئایا کەرەستەی تەواوی ئەم خۆتەیارکردنە لەبەردەمی رۆشنبیرانی کورددایە، وەک بۆ رۆشنبیرانی گەلانی دیکە لە دەستدایە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: هەرچەند دیوانی شاعیرانی کۆنی کوردمان لە دەستدایە کە بەدەستەواژەی وشەی رەسەن و، رستەی خۆماڵیی پڕ ئاهەنگ کەرەستەگەلی باشیان بەزەخیرەی فەرهەنگ و زمانی کوردیی بۆ بەجێهێشتووین، دوای وردبوونەوە و هەڵسەنگاندن، بەهیچ جۆرێک ئەو دیوانانە لە عاستی قەوارە و ژمارە و بوار و مێژووی کورد و ناودارانی کورددا نابینرێن.

دەبێ گەلێکی چەند ملیۆن کەسیی بەدرێژایی مێژوویەکی درێژ و پیاوگەلێکی وریا و رۆشنبیر و زانا... زاناکانی لەو چەند دیوانە بەولاوە کە لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕن بەرهەمی دیکەیان نەبووبێ؟

گەلی جار بۆ ئەم وەڵامە (نا)م بەکارهێناوە و، ئەمجارەیش بەهەمان (نا)وە کەمێک لەم عاستەدا دەوەستمەوە.

دوای کەمێک بیرکردنەوە بۆمان هەیە: بپرسین: بڕوا دەکرێ پیاوانی وەک (خانیی) و (خانای قوبادیی) و (ئەحمەد بەگی کۆماسیی) و (ئاهیی) و (فیکریی) و... دەیان و زیاتری هاووێنەیان کە تاک و تەرا لەم کەشکۆڵ و ئەو کەشکۆڵدا پارچەپارچە شیعری نایابیان دەبینین کە نیشانەی شاعیریی و بلیمەتیی خاوەنەکانیان پێوە دیارە... بڕوا دەکرێت ئەو شاعیرانە لە سەردەمی خۆیاندا دیوانی شیعری خۆیانیان نەبووبێت؟ لەوانەیە کە بڵێم: (نەء) زۆر کەس لە تەکمدا هاودەنگ بن.

جارێکی دیش دێینەوە سەر پرسیارکردن و دەڵێین: دەگونجێ ئەو هەموو شاعیرە بەیەکجاریی ئاسەواریان بڕابێتەوە و هیچیان لێ بەجێ نەمابێت؟ ئەمەیش جێگەی بڕوا نییە. لەگەڵ ئەمانەیشدا هەندێ جار بۆ ئەوە دەچم کە شاعیرگەلی وامان هەیە و هەبووە لە سەردەمی خۆیاندا ئەستێرەی درەوشاوەی ئاسمانی ئەدەبی کوردیی بوون و، لەوانەیە ئێستە ئێمە هیچ لە ناوەکانیشیان نەزانین. ئەم بۆچوونەیشم لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە مامۆستا مەلا عومەری ڕەنجووریی ناوی (٥٥) شاعیری کورد دەبات، دیاریشە مامۆستا لە خۆیەوە و بێ هەڵسەنگاندنی بەرهەمیان و بوونی ناو و شۆرەتیان لەو چەرخەدا، شایەتیی شاعیریێتی بۆ نەداون و، لەرز و کۆڕی شاعیراندا ناوی تۆمار نەکردوون. کەچی کە ئێستە سەرنجی مێژووی ئەدەبی کوردیی دەدەین جگە لەو ناوانەی مامۆستا ڕەنجووریی تۆماری کردوون، ئاگایەکی ئەوتۆمان لە هیچ بەرهەمێکی زۆربەیان نییە. کێمان دیوانی یان بەرهەمی (باکیی بیموشی) و (مەلانوور عەلی)و (ئەحمەد دۆڵەیی) و (مەلا بایندڕ) و (عەزیزوڵڵای لوڕ) و (جانگیر) و (مەنصوور) و (تەمەرخان) و (دەدەسێوانیی) و (نەظەر) و (کاکەوەند) و (وەلی خان) و (مەلا کامی نام) و (ڕەوانیی) و (مەولانا ئیلیاس) و... چەندینی دیکە کە دەرحەقیان دەفەرموێ:

هەنی ما باقی شوعەرای کوردستان
دڵداران خاص پۆل سەرمەستان
یانە هەر یەکێ جە یەک دیارێ
عەللامەی دەور بین جە رۆزگارێ
صاحیب کەیف و دیواخانە بین
هەرکەس پەی کەسێ وێران یانە بین
حەککاک و غەواص کان گەوهەر بین
صاحیب (فەرد) و (بەیت) سەودانەسەر بین
ئەی دنیای بێ شەرط چون دار شەطرەنج
یەک یەک نمانا پێشان یانەی رەنج



هەر یەک وە رەنگێ وەندشان جە پا
خەڵتانشان کەرد نەخاک سیا
ئیستە نەمەندەن غەیر جە نامشان
غەیر جە واتەی (فەرد) نە کەلامشان
هەر ئێد مزانی چەرخ پڕ خەتەر
موەزۆت نەدام جەوان بەتەرتەر
وەرە جە رۆی مەرگ (فەرد)ێ کەر ئیجاد
یاران دمای مەرگ باوەران وە یاد

کێمان هەواڵێ لە بەرهەمی زۆربەی ئەمانە دەزانێ کە هەریەکێکیان بۆخۆی (صاحیبی فەرد و بەیت) و شیعر و دیوان بووە و، عەللامەی چەرخی خۆیشی بووە؟

بۆ نموونە لە پارچە شیعرێکی ئەم کەشکۆڵەدا کە (صابیر) بۆ (شەفیع)ی نووسیوە، بۆمان دەردەکەوێت کە شەفیع جگە لەوەی لە گەلێ بابەتدا زانیاریی باڵای هەبووە، لە بابەتی ئەستێرەناسیدا (ڕەصەدساز) بووە و (مرصد فلکی) هەبووە! پێشتر کێ ئەمەی زانیوە؟

ئەمانەیش -بەزۆریی- بۆ پێش سێ سەد ساڵێک دەگەڕێنەوە، ئەی پێش ئەمان چی؟ هەرچەند ئاسۆی وەڵام زۆر تاریک و نتکە، هێشتا هیوابڕاو نین و دەڵێین: بەڵکو سووچ و کەلێن و قوشبنی وا هەبێت چەپۆکی چەرخی چەواشەی چەپگەردی پێنەگەیشتبێ و، بەرهەمی فیکری شاعیرانی هەست ناسکی بۆ پاراستبین و، ڕۆژێک بێت چاو و دڵی تینووی نەوەی ئەمڕۆ و دوارۆژیان پێ گەش و روون ببێتەوە.

زۆری ئەو گلەیی و بناشتانە گلەییەیە لە بەختی خۆمان و، هەوڵدانیشە بۆ وریاکردنەوەی چینی رۆشنبیری ئەمڕۆمان تا چەردەیەک لە زیانی قەرەبوونەکراوە لە سامانی کەلەپووریمان بزانن و، هەرکەسیش لە توانایدا هەیە، تا بەیەکجاریی کار لەکار نەترازاوە، لە ئاستی خۆیەوە دڵسۆزانە خەمخۆری پاشماوەی ئەم سامانە بێ وێنە بێت.

وەک ڕێگە پیشاندانێک ئەوەی من لەم چەند ساڵەی دواییدا بۆم دەرکەوتووە ئەوەیە:

١- هێشتا بەشێکی باش لەو سامانەمان لەملا و لەولا ماوە و مەترسیی گەورە هەڕەشەی لێدەکات و، چاوەڕوانی هەڵمەتی بەپەلەی دڵسۆزانی ئەم سامانەیە تا رزگاری بکەن.

٢- دۆزینەوەی هەر کەشکۆڵ و بەیاضێکی نوێ حەجم و قەوارەی ئەو زیانەمان بۆ دەردەخات کە بەدرێژایی مێژوو لێمان کەوتووە.

چونکە کەشکۆڵێکی نوێ - خۆی کۆنە و ئێمە تازە پێی دەزانین - نادۆزینەوە ناو و بەرهەمی چەند شاعیری تێدا نەبێت کە تا ئێستە بەر بای گوێی ئێمە نەکەوتوون.

هەر لەمەیشەوە دەگەینە ئەنجامی ئەوەی هەر ناوچەیەکی کوردستان و، هەر شارۆچکە و چەند گوندێک کۆڕ و کۆمەڵی ئەدەبیی خۆیان هەبووە، با لە شێوەی ڕێکوپێک کراوی ئەمڕۆی ئێمەشدا نەبووبێت، ئەوەتا کەشکۆڵێک کە لە ناوچەیەکدا نووسراوەتەوە - بەزۆریی - بەرهەم و شیعری ئەدیب و

شاعیرانی ئەو ناوچەی لە خۆگرتووە و، وەک بڵاوکراوەیەکی ناوچەکە گەلێ شوێنەوارییانی بۆ پاراستووین.

٣- ناوبردن و ناساندنی هەر کەشکۆڵێک و شارەزاکردنی خوێنەران لێی دەوڵەمەندکردنی ئاسۆی لێکۆڵینەوە و کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەو شاعیرانەیە کە شتێک لە شوێنەواریان لە دەستدا ماوە، بەڵکو وردە وردە دیوانی شیعریان کۆبکرێتەوە.

## دەبێ چی بۆ ئەم کەشکۆڵانە بکرێت؟

من سەرەتا کە بەتەنها باڵیی و سەرقاڵیی و کەم توانایی خۆمەوە دەستم دایە کۆکردنەوەی سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی، پێم لە بەرەی خۆم زیاتر رانەکێشا و، وزە و دەرامەتی خۆم دەناسی، بۆیە گوتم: با هیچ نەبێ وا دەست پێبکەم چ شیعر و سامانێکمان نەوازە و نەناسراو و -زیاتر- نزیکە بەڵایە لەوانەوە دەست پێبکەم و[٢]، ئەوانە لە چنگ لەناوچوون دەربێنم و، لەسەر بناغەی ئەم هەست و بیرە بەرگی یەکەمی (کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی) لە دایک بوو.

لەو رۆژەوە تا ئەمرۆ دنیا زۆر گۆڕاوە و، بواری ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردیی گەلێ فراوان بووە و، بزووتنەوەی چاپ و بووژاندنەوە و لێکۆڵینەوە هەنگاوگەلی بەرچاوی ناوە، لەم روانگەیەشەوە ئاستی بیری من لەسەر ئەو (بناغە)ی پێشوو پێداگریی ناکات و، لە تەک رەوتی رۆشنبیریدا ئاواتەکانی گەشە دەکەن، ئەوەبوو پێش ساڵی ١٩٩٣ لە کاتی پێشکەشکردنی بەرگی چوارەمی ئەم کەشکۆڵەدا نووسیم:

«ئەگەر کات و دەرامەتی رەسا هەبوایە و، پسپۆڕ و شارەزای خۆ تەرخانکردوو بۆ ئەم کارە بڕەخسایە، راست و دروستتر ئەوەبوو ئەو کەشکۆڵانەی لێرەدا باسیان دەکەین و شتیان لێ وەردەگرین و، تا ئێستە لە بواری کەلەپووردا ناویان نەبیستراوە، بێ جیاوازیی و جیاکردنەوە، یەکەیەکە هەموویان چاپ بکرایەن و بخرایەنە بەردەستی خوێنەران و شەیدایانی ئەم بابەتانە»[٣].

خۆشبەختانە دوا بەدوای ئەم نووسینەی من ئەم بیرۆکە کەوتە گەڕ و، کەسانێکی کارامە - ئەوانەی من بزانم - قۆڵی مەردانەیان لێ هەڵماڵیی و، چاپی سەرجەمی کەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمۆئمینی مەردۆخیی[٤] لەلایەنی مامۆستا ئەنوەری سوڵتانییەوە و، کەشکۆڵەکەی مەحموودی یاروەیس[٥] لەلایەنی مامۆستا عوسمان هەورامییەوە کەوتنە بەردەست و، پرۆژەی سەرجەمی کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشای جافیش لەلایەنی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمەوە بەرێگەوەیە و، هیواداریشین ئەمانە دوا

(٢) بڕوانە: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی، بەرگی یەکەم. ل: ٧.
(٣) بڕوانە: کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی، بەرگی یەکەم. ل: ٤.
(٤) بڕوانە: کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی گۆرانی، گردەکۆیی شێخ عەبدولمۆئمینی مەردۆخی. ساغکردنەوە و نووسینی ئەنوەری سوڵتانی، لەندەن، ١٩٩٨.
(٥) بڕوانە: کەشکۆڵی حاجی مەحموودی یاروەیس، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی عوسمان محەممەد هەورامی. چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، ١٩٩٨.



هەنگاو نەبن و، سەرەتایەکی هاندەر بن بۆ کار و پرۆژەی گەورەتر.

ئەگەر بێت و بەدەستی گەل و هەروەها هەڵمەتێکی مەردانە ببرێت و، کارێکی وا ئەنجام بدرێت ئەو کەشکۆڵانەی تا ئێستە تێدا نەچوون ببووژێنرێنەوە و چاپ بکرێن و، کتێبخانەی کوردییان پێ دەوڵەمەند بکرێت، ئەوە کەرەستەگەلێک دەخرێنە بەردەستی لێکۆڵەرەوانی ئەدەبی کوردیی کە تا ئێستە لەوە باشتر لە دەستدا نەبووە و نییە و، بەم کارەیش رێگە خۆش دەکرێت بۆ کۆکردنەوەی دیوانی گەلێ لەو شاعیرانەی بەختیان یار بووە و، شیعریان لە چەند کەشکۆڵدا نووسراوەتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەو دیوانانەی تا ئێستە بەلێکۆڵینەوەیەکی سووک و نابەکام و لاوازەوە چاپکراون دەکرێ لە عاستی کەشکۆڵگەلێکدا کە لەمەولا چاپ دەکرێن بەتێروتەسەلیی لێیان بکۆڵرێتەوە و، شیعری زیاتریان بخرێتە سەر و، هەڵە و کەموکووڕیی و ناتەواوییەکانیان تەواو بکرێت.

**جا کە هات و رۆژێکی ئاوامان بەخۆمانەوە دی - بەیارمەتی خودا (بۆ ئێمەیش نەبێ) دەبینرێت و تەنها کات و کۆششی دەوێت - ئەوسا رۆشنبیرانی کوردیش کەرەستەی دەوڵەمەندی دەوڵەمەندکردنی زمانی خۆیان لە دەستدا دەبێت و بەتەیاریی و زمانپاراوییەوە دەچنە کۆڕی نووسین و گۆڕەپانی ئەدەب و رۆشنبیرییەوە.**

## دیاریی بەرگی پێنجەم:

منیش دوای ئەم دە ساڵ دابڕانە لە بڵاوکردنەوەی کەشکۆڵ و، دوای ئەو گۆڕانەی بەسەر بواری چاپ و بڵاوکردنەوەدا هاتووە، جارێکی دیکە خۆم - با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت - دەخزێنمەوە ئەم بوارە و، بەدیارییەکی نایاب و، دەستەبارەیەکی شیاوەوە رووەدەکەمەوە کۆڕ و کۆمەڵی رۆشنبیران، بەهیوای ئەوەی دیارییەکەم بەهەند لێوەربگرن و، دەستەبارەکەم جێگەی سوود بێت.

دەبێ پێش دەستبەکاربوونم ئەوە لەبیر نەکەم هەرچەند لە گەلێ رووەوە بیروبۆچوونم لە بڵاوکردنەوەی کەشکۆڵدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لەو رووەوە هیچ نەگۆڕاوە کە کاتی خۆی لە سەرەتای بەرگی یەکەمی کەشکۆڵدا نووسیومە:

«... ئەبێ بەچاوی دروێنە و کۆکردنەوەی تێکڕای ئەدەب سەرنجیان بدەین، ئەمەیش وەک کاری دروێنە و خەرمان کوتان وایە؛ وەرزێر کاتێ درەوی گەنم یا جۆ دەکات سەر لەوە ناکاتەوە دەغڵەکەی چی تێدایە، دڕک و پۆڵکە و زەردەسیریی و مرۆر و... تاد لەگەڵ دەغڵەکەیا دەدووریتەوە و هەموویان کۆئەکاتەوە، جاری وا هەیە سواڵەیەک ئەدووریتەوە یەک گوڵی تیایە ئەویش پووچەڵە!...»

واتە: ئەم کارە کاری کۆکردنەوەیە و کاری لێکۆڵینەوە نییە و، دەبێ لەم دەرفەتەدا چیمان دەست دەکەوێت و چیمان بۆ دەکرێت بۆ کۆکردنەوەی ئەم سامانە بیکەین و، ئەم قۆناغە ئەنجام بدرێت، دوای ئەمە قۆناغی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە دێتەکایەوە.

دەکرێ پیاوی شارەزا و کارامە چەند دیوان لەو کەشکۆڵانە کۆبکاتەوە، هەروەک دەگونجێ لێکۆڵینەوەی تەسەل و رەسا لەسەر دیوانی چاپکراوی چەند لە شاعیرانی پێشوو بکرێت.

## چیرۆکی دەستخستنی ئەم کەشکۆڵە:

نازانم لە چارەم نووسراوە کە شایەتی کارەسات و رووداوی کاولکەر و خان و مان سووتێنی مێژوو و سامانی کەلەپووریی کوردیی و شوێنەواری زانایان و مامۆستایانمان بم، یان کارەساتەکان ئەوەندە زۆرن هەرکەسێ وەکو من بە شوێنیانا بگەڕێت کارەساتگەلی وەها دەبینێ کە من دەیانبینم!؟

لەو کاتەوە خەدەم داوەتە کۆکردنەوە و بووژاندنەوەی کەلەپوور و، وەک شەیدای ئەم بوار و ڕێبازە – بەگوێرەی توانا و کات – کارم تێداکردووە، لە هەر شوێنێک و لای هەرکەسێک هەواڵی بوونی دەستخەت و کەشکۆڵم بیستبێ چووم بەدەمیەوە و، ویستوومە هەواڵەکە بەدروستیی وەربگرم و، هیچ نەبێ ئەو شتانە ببینم و، بزانم چین و هی کێن. سوپاس بۆ خودا لەو رووەوە سەرکەوتوو بووم و شتگەلی باشم دیوە و، جێگەی هەوڵەکانم دیارن. ئەمەیش بەهۆی ئەوەوە بووە بۆ لای کەم مامۆستا و رۆشنبیر و خاوەن دەستخەت و کەشکۆڵ چووم کە بەدەنگمەوە نەهاتبێت و، یارمەتی نەدابم و، ڕێگەی سوود وەرگرتنمی لەوەی لە لایەتی بۆ خۆش و ئاسان نەکردبێتم.

لەم ماوەدا زستانی ٢٠٠٢ لە سەردانێکی کورتی سلێمانیدا بیستم مامۆستایەک هەیە چەند دەستخەتێکی لەلایە و، لەوانەیە جێگەی سوودبن. بەدەم هەواڵەکەوە چووم و، مامۆستام دۆزییەوە و، ماڵی ئاوابێت بردمیەوە بۆ ماڵەوە و(٦)، لە هەوڵ و کۆششی فرە و جێگەی سوپاسی زۆری خۆی ئاگاداری کردم و، پێی گوتم کە ساڵەکانی پێشوو لە حەفتاکاندا گونداوگوند گەڕاوە و، دەستخەتی کڕیوە و کۆی کردوونەتەوە و لەو کاتەیشەوە لای خۆی پاراستوونی.

دوای ئەم قسەوباسە نموونەی دەستخەتەکانی بۆ هێنام، بەڵام کە نموونەکانم بینی چیم بینی و چیم بەسەرهات؟ گێڕانەوەی ئەو رووداوە – هەرچەند ماوەیەکی کەم بوو – بەنووسین و گێڕانەوەی سەرپێیی و سەرزارەکی تەواو نابێت!

ئەوەندە بۆ مێژوو دەنووسم: کە مامۆستا نموونەکانی دایە دەستم و ئەمدیو و دیوێکم کردن، هەرچەند رۆژەکە لە چلەی زستاندا بوو و دنیا سارد بوو، یەکسەر لەشم کەوتە سەر ئاو و شەڵاڵی ئارەق بووم! ئەو دەستخەتە نایابانە کە بەری رەنجی مامۆستایانی کۆنمانن و، بەکۆشش و شەونخوونیی چەندان رۆژ و مانگ و ساڵ ئەنجامیان داون، لای ئەم مامۆستا، لەبەر بێ جێگەیی و کەم دەرامەتیی و بوونیان لە شوێنی خراپدا، شێیان هێنابووەوە و، وەک لە ئاو هەڵکێشرابن وایان لێ هاتبوو و، لاپەڕەکان بەیەکەوە نووسابوون و، نووسینەکان تیکەڵاو بووبوون. دەستخەتەکانیش یەک و دووان نەبوون و چیم بکردایە هیچم بۆ نەدەکرا کە لەو بارە نالەبارە رزگاریان بکەم. گەلێ لە مامۆستا پاڕامەوە و زۆری لەبەر لاڵامەوە کە بە زووترین کات شوێن و جێگەیان بگۆڕێت و بیاندات بە هەوادا و چی دەتوانێ بۆیان بکات.

مامۆستا بەڵێنی ئەوەی دامێ چی بتوانێ لە عاستیاندا بیکات و، دوای ئەوە هەندێک دەستخەت و

(٦) مامۆستا ئیسماعیلی خاوەنی کەشکۆڵەکە گوتی: ٢٠ ساڵ دەبێت ئەم دەستخەتانەم لەلایە و لەوکاتەوە تا ئێستە چەندین کەس هاتوون بۆ لام داوای ئەم شتانەیان کردووە، بەڵام ڕێگەی ئەوەم نەداوە کەس بیانبینێ!



کەشکۆڵی کوردیی و فارسی بۆ هێنام،، کە چاوم پێیان کەوت، بە یەکەم بینین شەیدایان بووم و، زانیم شتی باشیان تێدایە، بۆیە داوام لە مامۆستا کرد ڕێگەی ئەوەم بدات ماوەیەک لەلام بن و بەشێنەیی سەیریان بکەم، ئەمجارەیش ماڵی ئاوابێت، وەک گەلێ لەو مامۆستایانەی لەم بوارەدا یارمەتییان داوم، دەستی بەڕوومەوە نەنا و چۆنم ویست وا بەدەنگمەوە هات.

کە دوایی بەشێنەیی دانیشتم و سەیرم کرد بینیم لەناو ئەو دەستخەتانەدا کەشکۆڵێکی کەم وێنەی شاعیرانی کورد هەیە و، ئەم کەشکۆڵەیش سەرچاوەیەکی دیکەی -تا ئێستە- سوود لێ وەرنەگیراوی بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەب و کەلەپووری کوردییە و، ناو و بەرهەمی کۆمەڵێک شاعیری کوردی لە دووتوێی خۆی گرتووە، کە هێشتا ناویان لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا نەهاتووە. هەروەها بەرهەمی گەلێ لەو شاعیرانەی تێدایە کە ناویان هەیە و شتێ لە بەرهەمیان زانراو و بینراوە، بەڵام ئەو بەرهەمانەیان لێرەدا هەن هێشتا بڵاونەکراونەتەوە.

وام بەباش زانی لەم هەلەدا ئەم کەشکۆڵەیش وەک سەرچاوەکانی ئەدەبی کوردیی دی کە خستوومنەتە بەرچاو و دەستی لێکۆڵەرەوانی ئەدەبی کوردیی، وەها بخەمە بەرچاو و دەست و بەمێژووی ئەدەبی کوردی بناسێنم.

## باسێکی دەستخەتەکە:

دەبێ لە پێشدا – لەگەڵ سوپاسی چەند بارەدا – ئەوە نەبوێرم کە ئەم دەستخەتەم لەلایەن مامۆستا (ئیسماعیل کەریم سپیدارەیی)یەوە دەست کەوتووە.

تێکڕای دەستخەتەکە – ئەوەی کە ماوە – ٢٠٣ لاپەڕەیە، لە شێوەی بەیاضدا نووسراوەتەوە، بەپێوانەی (١٨×٧).

دەستخەتەکە یەکدەست نییە و، بەخەتی یەک کەس نەنووسراوەتەوە و، چەند کەس بەشدارییان لە نووسینەوەیدا کردووە، بەڵام بەداخەوە کەسیان شارەزایی باشیان لە نووسینەوەدا نەبووە و خەتیشیان خۆش نەبووە، لەبەر ئەمە هەڵەی زەق لە نووسینەوەکانیاندا دەبینرێت. هەر بۆ نموونە چەند دانەیەک لەو هەڵانە دەخەینەڕوو:

١- صفیل – لەباتی (سفیل – سەفیل).

٢- (طور کردن- تۆرکەردەن).

٣- (قضال- قطال) لەباتی (قتال- قەتال)

٤- (طرک- ترک- تەرک).

لە شوێنێکدا مێژووی نووسینەوەی پێوەیە و ساڵی (١٢٧) نووسراوە بێ نوختە کە هەڵدەگرێ (١٢٠٧) بێت، وەک دەگونجێ (١٢٧٠) بێت، بەڵام ئەمەیان راستە چونکە شیعری مەولەویی تێدایە کە بۆ مێژووی یەکەم ناگونجێت.

لە شوێنێکدا ناوی (عەبدولفەتاح)ی پێوەیە کە نووسەرەوەی دەستخەتەکەیە، لە شوێنێکی دیدا ناوی (غولام حەسەن)ی پێوەیە لە مێژووی ١٢٥٣دا، ئەم نووسەرەوە شتێکی کەمی نووسیوە. ئێمەیش

کەشکۆڵەکەمان بەناوی نووسەرەوەی یەکەم (عەبدولفەتاح) ناو نا.

ئەم کەشکۆڵە - وەک گوتم - لەناو ئەو دەستخەتانەدا بوو کە کورتەی بەسەرهاتەکەیانم نووسی. ئەمیش بەشی خۆی لە نم و شێ بەرکەوتبوو، کە هێنامەوە بۆ ماڵەوە دوو سێ رۆژ لەسەرخۆ خەریکی ئەمدیو و دیوکردن و وشککردنەوەی بووم تا نزیکی هەفتەیەکیش ئەو ژوورەی کەشکۆڵەکەی تێدابوو بۆچاڵ و بۆنی نمی لێدەهات!

ئەم شێ هێنانەوە و تەڕبوونە کاری گەورەیان کردووەتە سەر لاپەڕەکانی دەستخەتەکە و لەگەڵێ جێگەدا، کە پەڕەکانی بەیەکەوە لکاون، مەرەکەبی ئەمبەر داویەتیە ئەوبەر و، ئەوبەریش ئەمبەری بێبەش نەکردووە و، ئەمەیش کاری خوێندنەوەی ئەو دەستخەتە بەزەحمەت خوێنراوەی ئەوەندەی دی بەزەحمەت کردووە و، لە هەندێ جێگەدا لەتەک کۆنیی دەستخەتەکەدا ئەوەندە نووسینەوەکە کاڵ بووەتەوە کاتێ خەریکی خوێندنەوەی دەبی، وەک ئەوە وایە لەژێر هەوری تەنکدا بۆ مانگی یەکشەوە بگەڕێیت!

بەهەرحاڵ، بەزەحمەتێکی زۆر و شەونخوونییەکی زۆرتریش ئەمەی کە دەیبینی بۆم هێنراوەتەوە سەر رێنووسی ئێستەی کوردیی و، گومانم لەوەدا نییە کە وەک پێویست بۆم ساغ نەکراوەتەوە، بەڵام بەوە دڵخۆشم درێغییم لە عاستیدا نەکردووە و، گوێم بەماندووبوون لە رێگەی ساغکردنەوەیدا نەداوە و، مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش لە ساغکردنەوەی (دیوانی خالص)ەکەدا کۆمەکیی کردووم.

لێرەیشدا ناوەرۆکی کەشکۆڵەکە دەنووسین:



## ناوەرۆکی کەشکۆڵەکە

١٣٢- حەسەن
١٣٤- خالص
١٥٠- خانا
١٥٢- خالص
١٥٦- حەسەن
١٥٧- شەفیع
١٥٩- ئەحمەد بێک
١٦٣- صادق
١٦٤- خالص
١٦٨- مەولانا مصطەفا
١٦٩- دز و قازیی، بەفارسی
١٨٣- دوای دز و قازیی مێژووی ١٢٧٠ی پێوەیە، بەڵام نوختەکە نەنووسراوە و تەنها (١٢٧) رۆژی سێشەممەی حەوتی مانگی رەجەب نووسراوە.

لێرە بەدواوە پەڕەکان هەڵەوگەڕاو دانراون و ئێمەیش بەو پێیە لە نووسینی فیهرەستەکەدا گەڕاینەوە بۆ سەرەتاکەی.

٢٠٤- حیکایەتی فەقێ و جۆڵا.
٢٠١- کەلامی مەلارەحیم -مەولەویی-
١٩٩- حەوتبەندی خانای قوبادیی
١٩٣- شەفیع
١٨٩- ناوی نووسەرەوە عەبدولفەتاح
١٨٩- رۆڵەبزانی - مەلا خضر
١٨٦- مەولەویی



## ئەم کەشکۆڵە چۆن بڵاوبکرێتەوە؟

وەک پێشتر گوتم تا ئێستا دوو کەشکۆڵ سەرلەبەر بڵاوکراونەتەوە و کەشکۆڵی سێهەمیش بەرێگەوەیە. سەرنج و تێبینیم لەسەر دوو کەشکۆڵە بڵاوکراوەکان هەبووە و، هەندێ لە تێبینییەکانم لەسەر کەشکۆڵە رەنگینەکەی شێخ عەبدولمۆئمین نووسی کە مامۆستا ئەنوەری سوڵتانیی بڵاوی کردووەتەوە و[٧]، یەکێک لە کارە چاکەکان کە لەو کەشکۆڵەدا کراوە ئەوەیە فۆتۆی هەموو کەشکۆڵەکە وەک خۆی بڵاوکراوەتەوە و، بەم کارەیش خوێنەر دەتوانێ گومانی لە هەر شوێنێکی دەقە چاپکراوەکە بوو بگەڕێتەوە سەر فۆتۆکە و بەرانبەریان بکات و، رای خۆی لە ساغکردنەوەکەدا دەرببڕێت. ئەمەیش کارێکی زۆر باشە؛ چونکە وەک گەلێ جار نووسیوومە و گوتوومە[٨] لێکۆڵەرەوە لە عاستی دەقێکی کۆنی کوردیدا کە بەرێنووسی کۆن نووسرابێتەوە دەبێ وەک ئەوە هەڵسوکەوت بکات کە خەریکی دۆزینەوەی مەتەڵ بێت. جا کە خوێنەر دەقێکی ساغکراوە و بەرێنووسی ئێستە نووسراوەی لەبەردەستدا بێت و، دەستی بەدەستخەتەکە نەگات ناتوانێ رای لەسەر هەموو شتێک دەرببڕێت، وەک ناتوانێ هاوبەشی لێکۆڵەرەوە بێت و، خۆیشی بێگومان بێت لە عاستی کاری لێکۆڵەرەوەدا.

منیش لەبەر ئەم هۆیانە - هەرچەند دەستخەتەکەی لای من زۆر کۆن و پەرپووتە و هەندێ شوێنی لە وێنە و فۆتۆدا دەرناچێت - ئەم رێگەم پەسەندکرد و وێنەی تەواوی دەستخەتەکە لە دوای چاپەکەوە بڵاو دەکەمەوە و، بەژمارەی لاپەڕەکانیش ئاماژە بۆ شوێنی هەر پارچەیەک لە شیعرەکان لە دەستخەتەکەدا دەکەم و لە هەر جێگەیەکی چاپەکەدا (.../ف) ئەم نیشانە بوو ئەوە ئاماژە بۆ لاپەڕەی دەستخەتەکە دەکات بەو ژمارە.

### تێبینی:

جگە لەوەی -وەک گوتم- لەبەر گەلێ هۆ، لە سەرووی هەموویانەوە، دەستخەتەکە کۆن و دڵۆپەلێدراو و پواوە و نووسەرەوەکانی نەشارەزا و نیمچە خوێندەوار بوون، نەمتوانیوە ئەم کەشکۆڵە بەدروستیی بێنمەوە سەر رێنووسی باوی کوردیی، لەوانەیە کارگەلی دیکەیش، کە جێگەی سەرنجن، لە نووسینەوەکەمدا روویاندابێت، لە پێش هەموویانەوە خۆم دەڵێم:

* لە زاراوەی گۆرانییدا بۆ نووسینی (مبو- مەبۆ) هەندێ جار ئاڵۆزیی دروستدەبێت؛ چونکە لەم زاراوەدا ئەم وشە بە دوو جۆر گۆ دەکرێت:

یەکەم: ئەگەر بۆ (نەفی) بڵێین (ممبو-ممەبۆ) ئەوا بۆ (ئیثبات) دەڵێین (مەبۆ).

(٧) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغیی، گەشتێک بەکەشکۆڵەکەی شێخ عەبدولمۆئمیندا، (ئەم وتارە دووجار بڵاوکرایەوە) جارێک لە ژمارە ٢٥ی گۆڤاری (گزینگ)دا و، جاری دووەم لە ژمارە ١٤٦ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا.

(٨) بۆ نموونە بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغیی، دیوانی وەفایی، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا ١٩٧٨، چاپی یەکەم، ل: (بیست و شەش).

دوەم: ئەگەر بۆ (نەفی) بڵێین (مبو- مەبۆ) ئەوا بۆ (ئیثبات) دەڵێین (مبۆ).

جا لەبەر ئەوەی ئەم کەشکۆڵە (کەشکۆڵە) و شێوە و زاراوەی ناوچەی جیاجیاکانی (گۆرانیی) لەخۆ گرتووە، دوور نییە ئەم لایەنە باش پەیڕەویی نەکرابێت.

* کورد کە هەندێ وشەی عەرەبیی باو و سواو و خراوە ناو زمانی کوردییەوە، بەکار دێنن هەموو بەیەک جۆرێ ناڵێن، لەوانە: وشەی (عشق) کە هەندێ دەڵێن (عیشق) و هەندێکی دی دەڵێن (عەشق) لێرەدا هەردوولایان هەیە.

* بۆ رێکخستنی بابەتەکانی ناو ئەم کەشکۆڵەیش، دەکرا و باش وابوو- زنجیرەی بابەتەکانی تێکنەدەم، بەڵام لەبەر ئەوەی کەشکۆڵئاسا نووسراوە و بابەتەکانی یەکیەتیی بابەت و بۆنەو موناسەبەیان تێدا نەبوو، بەو شێوەی ناو کەشکۆڵەکە خوێنەر هەندێک چەواشە دەبوو و، کە بۆ شیعری شاعیرێک بگەڕایەت دەبوو چەند شوێن بگەڕایەت، بۆ نموونە شیعری (خالص) لە چەند جێگەدا نووسراوە و، هەروەها شاعیرانی دیش، بۆیە ناچار بووین زنجیرەی کەشکۆڵەکە تێکبدەین و، شیعری (خالص) پێشبخەین و، ئەوانی دیش بەدوایدا بنووسین.

* دەستخەتەکە جگە لەو شیعرانەی دەیانبینی، حیکایەتی دز و قازیی بەفارسی بەپەخشان تێدا بوو، وامان نەبینی کە خزمەتێک بە کەلەپووری ئەدەبی کوردیی دەکات، بۆیە بەپێویستمان نەزانی بینووسین و، پشتگوێمان خست.



## دیوانی خالیص

تا ئێستە لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیی، جگە لە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ رەزای تاڵەبانیی کە نازناوی شیعریی خالیص بووە، ناوی شاعیرێکی کوردمان نەدیوە کە نازناوی شیعریی (خالیص) بێت.

لە کەشکۆڵی عەبدولفەتاحدا (٢٧) پارچە شیعر هەیە لەژێر نازناوی (خالیص)دا و، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم (خالیص)ە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ رەزا نییە، بەڵام لەمە بەولاوە هیچی دی لەسەر ئەم شاعیرە نازانین و، ئەمە یەکەمجارە کە ناوی دەکەوێتە ناو ناوان. لەگەڵ ئەمەیشدا شیعرەکان یەک نوسخەن و، دەستخەتەکە کۆن و دڵۆپە لێدراوە و، نووسەرەوەکەیشی خوێندەواری باش و شارەزا نییە، بەڵام هەرچۆن هەیە ئێستە هەر ئەمە لە دەستدایە و، چۆنمان بۆ خوێنراوەتەوە و ساغکراوەتەوە وەها دەیخەینە روو، بەڵکو لەمەولا زانیاریی و شیعری زیاتری ئەم شاعیرەیشمان دەست بکەوێت و، بتوانین دیوانێکی خنجیلانەی بۆ ساز بکەین.

لێرەدا ئەوەندە دەڵێین: دوای ئەوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرەمان یەکخست و تۆزێک لێی وردبووینەوە بینیمان لە رووی ژمارەی پارچە شیعرەکانەوە لە شیعری شاعیرەکانی دی زۆرترە. کە لە رووی ناوەرۆک و بابەتی شیعریی و مانا و مەبەستیشەوە سەیری دەکەین دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەم شیعرانە زۆر سەرکەوتوون و لە خانەی قوتابخانەی شیعری مەولەوییدان و، خالیص بەتواناوە شان لە شانی مەولەویی و هاوشانانی دەدات... بۆیە ئەم شیعرانەمان لە سەرەتای ئەم کەشکۆڵەوە دانا.

-١-

(ف/١٣٤)

دەردەکەم دەرمان دەردش دووچارەن
مەردەنیم فەرزەن ژیانم ژارەن
پاسە مەعلوومەن قەدر زەمانەم
نە مەندەن جە لام هەرەس وەیانەم
دڵ جەی بابەتە فرێ مناڵۆ
نازداران پەنەم مواچان خاڵۆ
من کەی خاڵۆ بیم؟ خاڵۆتان مرۆ!
ئەی خاڵۆ تالآن خاڵتان کەرۆ
من جەی وەر نامم خەیلێ عەزیز بی
جە زبانتان تەمام لەزیز بی
ئیسە نامەکەم پەی چێش پەنهان بی؟
جە لاتان خاڵۆ ویرد زوبان بی

خوداوەند ئەی حەق لێتان بستانۆ
کوورەی نار عیشق پێتان بنمانۆ
بزانان خاڵۆ دڵ پەسەندیدەن
یاخۆ ناپەسەند چوون مووش سفیدەن
قەسەم وە خاڵان دانە دانەتان
وە تاتای زوڵفان دانەی شانەتان
هەرچەند وە خاڵۆ بوەران نامم
جە نێم نیگاتان نۆ مبۆ زامم
خاڵۆ مەر وەختێ هەوای خاڵتان
نەسەر بەرکەرۆ نەخاک بۆ خەڵتان
(خاڵص) بناڵە بگرەوە پەی وێت
دیتە نازداران خاڵۆ ماچان پێت!
مەر وەختێ شادیم ئەی خەمە ماڵۆ
هەنی نازداران نەواچۆ خاڵۆ

-٢-

(١٣٥/ف)

ساقیی بۆ بەعیشق پیر مەیخانە
بەو بادەی بێغەش جام مەستانە
وە قەترەی صافی ئەو پیاڵەکەت
بماڵ ژەنگ دڵ پەشێو حاڵەکەت
پەشێوەن حاڵم نەپای بێکەسیی
حەقدارم تۆنی، تۆ وە من کەسی
مازە بەربشۆ گیانم وەزەلیل
پەنام ئاوەردەن هەر وە تۆم دەخیل
چەم وە ئیشارە جام وە دەستەوە
چون طاوس مەست وە مەست مەستەوە
نە بیسات بەزم مەجلیش ئارای مەی
تۆ بدەر بادە من واچوو: ئۆخەی!

(١) لە بەرگی یەکەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوەدا باسێکی خاڵۆ و خاڵ و ...م کرد، ئەم بابەتەیش لەو بابەتانە دەچێت لەوێ ئاماژەیان بۆ کراوە. (بڕوانە سەرچاوەی ناوبراو ل: ٢٣٢).



نەو بادە و نەو دەست نەو لەنجەولارە
نەو شەوق و نەو رەقص دڵ پێ ئاوارە
(خاڵص) دەردەکەش خاص جۆش باوەرۆ
سەر فنجانەی خەم خاص - خاص نۆش کەرۆ

***

-٣-

(١٣٥/ف)

کردەی کردەکەم دەورانم تەندەن
نامەی نەومێدیی صاڵحیم وەندەن
خەیاڵ ماضیی دەورەکەی دەورم
مەزەی شەبابەت توور پڕ جەورم
بییەن وە باعیث شەوق و زەوقەکەم
نەزا و مەجلیس ئەهل سەوقەکەم
پاسە مەعلوومەن رای نەجات بەستەن
نە (یوم الحساب) میزانم پەستەن
مەر ئەو ئایەکەی (لاتقنطو)دا
پەردەی حیجابم باوەر وە روودا
باوەرووم وە بەر... پەی پەی
مەی گێج عومان عیصیان (پرو) پەی
وەرنە بازیم وەرد، بیناییم کۆر بۆ
دڵەکەم لەتلەت زەخم ساتۆر بۆ
ئاخر وە رەزای ئەو کەردم بازیی
ئیسە رەزاکەش بی وە نارازیی
ئەی خودا سا مەرگ کێ مکەرۆم چار
نمەز وەلای کێ بوەروون هاوار؟
جەی شەرمەندەگیی چێش دەروو جەواب
چێش واچوو نە وەقت عەطا بۆ صەواب؟
(خاڵص) بناڵە وەی ماجاراوە
وەی دام تەلبیس فانیی سەراوە
ئەو سەردارەکەی شافیع مەحشەر
پرسۆ: چێش ماچی؟ خاکت بۆ وە سەر!

-٤-

(١٣٦/ف)

سفارشنامەی لوطفەکەت یاوا
سەرم نە پای چەرخ هەفتەمین ساوا
ڕەوییەی بزورگییت وەجا ئاوەردەن
وەی خدمەت ئێمەت سەرئەفراز کەردەن
[توت!] طەڵەب کەردەن جە رووی مەیلەوە
نەی قەیس قەدیم جا دوجەیلەوە
ئەروام وەپێشواز ئەی شەهەنشا بۆ
دیدەم وەسەر گەرد چاشنەی غەزا بۆ
سا چون عازیمەی ئەی لوطفە پێم بۆ
خاصەن جەی شادی شیوەن خدێم بۆ
بەڵکم نە هەوای سەرمەشق نەمای عەشق
تەشیرێ جەوشێن باوەرۆ سەرمەشق
تا (خالص)ەکەی دڵ نە خەم مەحکەم
جە دەست عیصیان دایم هەرس نە چەم
خەلاص بۆ نە فیکر پەژارەی دەروون
شا بۆ وە دیدار یار بێ نموون

-٥-

(١٣٧ /ف)

شرینەن زوڵفان پەروەردەی گوڵاو
گا کرژەن گا لوول، گا خامەن گا خاو
کلافەن، نەرمەن، دێزەن، قەترانەن
پڕ پێچەن، صەفەن، سەهمش گرانەن
دامەن راگیرەن، تەرسای دیرتەن
نە ئاماو لواش شێخ نەگیرتەن
سەراوێز نە دۆش سیامارانەن
ئەوان سیامار جە خوانخوارانەن
واوەیلا پەرێ مەجنوون بەختانەن
هەرەس پەی یانەی زامەت سەختانەن



(خالص) جەی زوڵفان دڵ ئاهرینەن
چون ئازیز مەردان هەر نەگرینەن

***

-٦-

(١٣٧/ف)

بەرگ ئازییەت قەڵاخیی کاڵان
هەرچەند قەڵاخەن لایەق بەو باڵان
شەوق ئازییەت ها بەو کاڵاوە
بەڵا وە شەرتێ هەر وەی باڵاوە
شیوەن ها وە ناز هەرس و غەمزەوە
واوەیلا وەنای هەزار رەمزەوە
کڵفان زوڵفان وێش پارە کەردەن
مناش مکەردی ئازیزش مەردەن
هەر دان وە سەردا زێوەر منمانۆ
نموونە جە دەست نەققاش مستانۆ
ڕووی جەمین وە هوون زەرب دەستەوە
ڕازیان وە رەزن دڵ پەی قەستەوە
منمانۆ وە چەشن هوون وە بەرفەوە
نەک زەرەر رەسان بەرف صەرفەوە(!)
(خالص) ئازیزت پەرێت بی وە سەیر
ئەروای جەنازە داخڵ بۆ وە خەیر

***

-٧-

(١٣٨/ف)

لاحەول پەی دیدەش
شەرتەن بواچەن لاحەول پەی دیدەش
پەی [أثرو] موژان وەناز کەشیدەش
وارانەن نەجۆش دڵەی خەم دیدەش
ئاخر نیگاکەن یاران دینیی
کێ دییەن شێوەن وەی نازەنینیی؟

نە مەطڵەب نە سۆز سینەی بەرینەن
نە شیرینی وێش... شیرینەن
ڕازانش پەردەی دڵ مەکاونۆ
وە ئاه و ناڵەی سەنگ متاونۆ(!)
پەنهان کەردەن ماه وە ئەثر جەمین
چون دانەی مروار نە مابەین [جەبین!]
ئای ئای نەی شێوەن وڵات بێ بریان
قیامەتش کەرد ئەی چەم گریان
(خاڵص) بەختەکەت خاص سەر نەخاوەن
نەی شین پڕ ناز ذەوقت بڵاوەن

***

-٨-

(١٣٩/ف)

میرزام تۆر کەردەن
شاباز شادیی جەلام تۆر کەردەن
پارچەبەند نەپا جلغۆ نەگەردەن
تەشریف وە یاتاخ بێ مەیلیی بەردەن
مایەی وەفا و مەیل نەمەندەن جە لاش
کەنارە کردن جە نشین کو جاش!
چەند ملاونۆش قووقوو مکەرۆ
وە راگەش توعمەی غەزا مەوەرۆ
فێشتەر دەڵ مبۆ نە دیدارمان
نێش مدۆ نە ئێش دڵەی خارمان
کۆ خێر ئەندیشێ نەرای خێر وێش
صەییاد خاس بۆ فامێ ببۆ پێش
ڕام کەرۆ بازم چون جەی وەرتەرین
پەی چەش و چەشتەی شیرینی شیرین؟
خیلاف خەلەت رای مازی کەرۆ
هەنی باز بازیی بەدان نەوەرۆ
نەک جە ناسکیی طەبع شەریفش
نەلەنجۆ لەنجەی عیشوەی زەریفش



نە هەوا و هەوەس دەور سەیرانش
جە نیمنیگای ناز دیدەی جەیرانش
بگنۆ وەدەست ناشیی صەییادێ
نابەڵەد جە باز خاتر ناشادێ
بێ لانە و قوشخان ئەبلەی نادانێ
خەرمەوهرە نە جای دانەی لاڵ خوانێ
بەتەرەف کەرۆ باز تەڕلانم
[بوزو و بینی!] لانە و قوشخانم
هەمە! شکار هەم سەردەنەچیر بۆ
بێ قەدر و قیمەت خان و وەزیر بۆ
چون عوقاب خام هەنی بنمانۆ
تەجرەبەی کەبک کەشف نەزانۆ
(خاڵص) جەی بابەت دەروونش خارەن
باز تۆرش کەردەن ناشیی شکارەن
گۆش مەدۆ وە راز نادانان دێر
دەورش بێدادە مەگنۆ جە سێر

***

-٩-

(١٤٠/ف)

جە تۆی دڵ سەردا
دیسان ئارەزووت جە تۆی دڵ سەردا
خەیاڵت ئاهیر نەجەستەم وەردا
ئێش گیانکێشان مەردەن خەبەردا
میراو سەرجۆی دەروون هوونرێز
خەریکەن وە دەست شەلکەی سەراوێز
وازو کەشت بەرز شادیم خەراو کەرد
تاسەت تاس وەنەم گێج سەراو بەرد
تەبدیلەن ذەوقم وە خەرمانەوە
دایم هەرس هیجر وە چەمانەوە
رەنگ زایەڵە و ظوڵم جەور دووریتەن
ژەنگ نک بەستەی بێ صەبووریتەن

پەستیی سەختیی بەخت پێم ئاشکارەن
پەڕ پای دەلیل پای راویارەن
نە کەس کلید حوجرەی دڵ پێشەن
نە کەس باخەبەر جەی ئێش و نێشەن
سا مەر ئەو سانیع بێ شومار صنعەت(١)
سەرمەشق عاشق کێشابێ پەرگار
جە حاصڵ وەصڵ کەرۆمان دڵشاد
وەرنە (خاڵص) فەوت عومر تۆ زیاد

-١٠-

ئیمشەو خەم وەنەم تیپ ئاراکەردەن
غارەت یانەی شەوقەکەم بەردەن
کەیفم بێکەیفەن تاڵانش بریان
بارخانەی ذەوقش نە بێخ بارکریان
دڵ مەلوول بییەن شادیش بەتاڵەن
ئەحواڵم بێحاڵ حاڵم بێحاڵەن
دەماخم ناچاخ چاخ دوماخەن
هۆشم بێ گۆشەن فامم دوستاخەن
نەیچیی فیداتم وەخت نەواتەن
با بەیۆ صەدات سەرم نە راتەن
ئەو مەقاماتەی بە وێت مزانی(٢)
لەنجە [مورسیش!] وە ئەرواح مستانی
سابکەر ئاغاز وەقتم درەنگەن
دڵ بتاونە ئەر صەد لە سەنگەن
جە تاوی تاوان هیچ مەکەر درێغ
لەرەی نەواکەت بوڕان بۆ چون تێغ
بەڵ بە یومن تۆ فایدە دەرۆ
پەی حاڵ (خاڵص) مەنع وێش کەرۆ

(١) ئەمە لە دەقەکەدا وا نووسراوە بەڵام رەنگە هەڵەی نووسەر بێت و راست وایە (...سانیع صنعەت بێ شومار) بێت.
(٢) ئەم نیوە بەیتە لە دەستخەتەکەدا نووسرابوو: ئەو مەقاماتەی مزانی بەوێت، بەڵام بەهەڵەم زانی وەک سەرەوە نووسیم.



نوور شەو دینش وە دنیای بێ پۆ
جەی گشت عیصیانە ئینصافێ دەرۆ

***

-١١-

(١٤٢/ف)

ئیمشەو دیارەن بڵێسەم سەندەن
کوورەی نار خەم دەورانم تەندەن
ئاهیر وارانەن وە دەورانمدا
گڕەن وە خەرمان بێ سامانمدا
کڵپە گرتەن دڵ وە مەحاڵاتش
نەک هەر مەحاڵات جینس ماڵاتش
یە کێ بۆ بەیۆ وەی هاوارەوە؟
وەی هاوار سەخت کەس نەدارەوە
مەر هەر تۆ ساقیی فکرێ وەی حاڵەت
بکەری وەجام دەست و پیاڵەت
ڕەشحە نەو بادەی صاف بێگەردت
برێزی نە حەلق بەندەی رووزەردت
خامۆش کەی ئەی نار چون نار خەلیل
وە عەطای عەمیم بێ هەمتای جەلیل
صەد جار وەسەرگەرد دەست و بادەت بۆ
هەزار گیان پێشکەش لەوح سادەت بۆ
وە قەترەی عەرەق ئەو پیاڵەکەت
(خاڵص) چاکیر بۆ نەو دەرماڵەکەت

***

-١٢-

(١٤٣/ف)

سەرعێل تۆ سووریاش خێڵ دڵانی
باخەبەر نە حاڵ دڵ خەجڵانی
مەئموور فەرمان ڕەزا و ڕەحمەتی
نەک باعیس وە ئێش سزا و مەینەتی

صەد بێ بارەوەر دڵ بێ حاصڵم
منیش هەم داخڵ خێڵخانەی دڵم
ئەر خێڵ مالاتش بشۆ وە تالان
پەرێ تۆ عەیبەن پەی من شەونالان
ئەی هەردە و هەوار ئەی مەحالاتە
بەد مەنزڵێوەن پەی ئەی خێلاتە
مافەتەش ماچیی وە دەست کاڵییان
دەست خاڵیی مبی چون دەست خاڵییان
وە دەست خاڵیی یاوای بەو مەنزڵ
سەر ئەفگەندەنی دەست پاچە و خجڵ
موستەوفیی دیوان دەفتەرت وانۆ
حیساب مالات سوورباشیت زانۆ
حاکمەکەی عەدڵەن خەبەر مپەرسۆ
جە باسی خواسش کوان ملەرزۆ
دەغیلم ئامان سوورباش دڵان
هۆشت وە خێڵ بۆ جە گشت مەنزڵان
مالات نەکا قڕ خێڵ پەراگەندە
نەپای ئەو دیوان بوی شەرمەندە
دەستم دامانت زینهار صەد زینهار
وە هەوای نەفس دڵ نەکەری کار
نەفس هەر ئەو نەفسەن وەختێ کەرد هەوا
پەی دانەی گەندم ویش کەردش رسوا
فرێ نەماوی دەوڵەت بابا
یەکسان بدەرۆ وە باد فەنا
با وجود ئانە پاک لە دەوڵەتم
وە بێ دەوڵەتیی کێشان خەتم
وەرنە شەباشبت دۆستیی کەردم
یەکجا پەی بێشکەش ئامارە بەردم
جە بێ ئینصافیی بێ مووچە و بەرات
بێشکەشش بەرۆ هیچ نەدا خەلات
ئیسە کاکە دڵ زەرەر ئاوەردەن



خاطرە کەش نالآ پەشیمان وەردەن(!)
هاومالان بارکەرد یاوان بەهەوار
ئێد بی بارەوەر دەست پاچە و زگار!
تالان تالانەن نە گشت سەر دیار
وەی بارخانەوە جەی کۆنەهەوار
مەندەن خەفەتبار وە بێ پاو و دەست
وە بێ هاز و هێز نەڕووی سەرزەمین پەست!
نە کەس شناسۆ نەئیلتیماسەن
نە پەنا و پەردە نە حاشا و باسەن
نمەز چێش کەروو نەی خەوف و ئەندێش
خۆ مەرگیش نییەن باوەرۆ پەی وێش
سەرعێل سا شەرمت نەی ماجەرا بۆ
نەی موعامەلەی نەفس و هەوا بۆ
هۆشت وە دەوڵەت میزان عێل بۆ
نەوا وە هەوای نەفس پاشێل بۆ
مەنزڵان سەقیل هەوار ناساز بۆ
بێ نەوا زەرەر رسوای طراز بۆ
(خاڵص) ئەیوەصیەت پەی وێش ناوەردەن
وێش نەدەست شییەن بەڵ پەی تۆ کەردەن

***

-١٣-

(١٤٥/ف)

خەم دەورانم تەند نمەز یە چێشەن؟
دایەرەی دەوران دەروونم رێشەن
چون بۆتەی زەرگەر مجۆشۆ نە کۆڵ
گلش چڵ مدۆ نە دەوران دڵ
فەڵەک هەم کەڵەک خەم پێم رازنای
شاباز شادیی دڵ پەروازنای
وارانەن یاران خەرواران خەم
پەی جەستەی خەستەی پڕ ئێش ماتەم
سا دەی فرصەتەن نەردت بشانە

هەر سزا دەر پێم گیانم بستانە
ساقیی تۆیش نەی دەم وە ئیحسان وێت
باوەر باقیی دەی وە پیاڵەی وێت
لەبرێز بۆ قەدەح کێشۆ وە سەردا
وە یاد ئەو کەس درنەی خەیبەر دا
موطریب نەغمەی نەی چەنی صەدایێ
وە نەوای شیرین بە وەی ئاشنایێ
سەمتوور وەصفولحاڵ حەزین دڵانان!
قەدرێ بوانە پەی حاڵ نەزانان
دەروێش کەف وە دەف پۆست پاسەوە
[او ماس فیش بەرە وەرووی باسەوە!]
با دەنگت بەیۆ وە دایرەوە
خاص جەستەم بنێی وە ئاهیرەوە
بلێ وە ئاهیر شێخ کەرد تەواسا
قورئان سۆچنا زوننار شناسا
ئاخر ئەی (خاڵص) پەشێوەن حاڵش
خاڵ خاڵخاصان وێران کەرد ماڵش

***

-١٤-

(١٤٦/ف)

خاڵت خاص خاڵەن خاص پەشێوم کەرد
خاص خاص خەمانم وە خەیاڵ ئاوەرد
خاص بی خەیاڵم خاص کەرد خەیاڵت
رسوا و سادەلەوح پەی نوختەی خاڵت
هەراسان بی هەرس زوڵفان تاڵت
دڵ مەلوول و زار شەوق جەماڵت
تاقەت کەردەن تاق تاق ئەبرووان
مەست (لایعقل) سەرای لەبرووان(!)
چاوەکەم – چاوم! – بینایش نەمەندەن
ئەر مەندەن زەرە جەو زەردە خەندەن
سەوگەند بەو سورمەی پای موژەی ئەڵماس



دڵ فاریغ نییەن ساتێ جە وەسواس
هەرچەند تۆ مەیلت چەنیمان جیان
دەروون وە پەیکان دیدەت پێکیان
تا (یوم الممات) نیشت ها نە جەرگ
نییەن خەلاصیی نەزاوەن وە مەرگ
جەو بۆنە دڵ وەش جەی تیر و نیشان
سەوقاتەن پەرێ شار خامۆشان

***

-١٥-

(١٤٦/ف)

ئەرێ هەی دڵەی خاتر نەخەم تەنگ!
بێ شادیی و بێ ذەوق وێنەی سیاسەنگ!
یە مەردەت مەردەن وەی تەور رێشەنی
یا کۆست کەفتەن پڕ ئەندێشەنی؟
پاسە مەعلوومەن دێوانەی سەرشێت
پەشیمانەنی جە کردار وێت
جە کول مگیرۆ نەزاوەن مەردەن
وە کۆ میاوۆ پەشیمان وەردەن؟
بارەن بارخانەت مشۆ وە مەنزڵ
مایەت ناڕەوان دەست پاچە ماتڵ
پارچەی شارەکەی خامۆشان ماوا
ماوای گردەکەن صوب یا خۆرئاوا
هامسەران نەو جا بساتێ داران
هەرکەس مایەیێ پەی وێ مداران
ئمەز من و تۆ مایەمان کامەن
کامین مایەمان پەسەند عامەن!
ئەرێ هەی بەدبەخت تەدبیرت چێشەن؟
من پەی ئەی سەفەر خاترم رێشەن!
صەراف بازاڕ پێغەمبەر وێشەن
ئەر هەی رووسیا جەوابت چێشەن؟
نە خەجاڵەتیی خۆ نییەن عارت

ئاخر کۆ یاوا قەدر و میقدارت؟
چەند جار واتم پێت، چەند جار دادم کەرد؟
فایدەش نەوی سەختتەر ویت جە بەرد!
سا هەر خەیاڵ کە پەی کاری کەردەت
جە دەست بەرشییەن خاسیی وییەردەت
(خالّص) مەتڵەبت نەکەمەند بەرشی
بیناییت کۆر بۆ، تازە مەکۆشی؟!

***

-١٦-

(١٤٨/ف)

سەروەرەکەی خاص رووی دەشت مەحشەر
شەفاخوای زومرەی عاصیان یەکسەر
شەریف کەردەی ذات یەکتای بێهەمتا
شای تاج لەولاک وەحدییەت ماوا
هەر رووسیای جەمع چەند یارانم!
بارکەفتەی رەحیل سەر هەوارانم
دەست کۆتا و پا لەنگ بیناییم کوورەن
شەرمەندە و سەفیل هەوارگەم دوورەن
دیارەن دەوران کۆچم نە کارەن
هەرچەند بار سەنگین چار ناچارەن
لابەستەن ئەی کۆچ مبۆ کەردەنش
مەنزڵ وە یاتاخ فانیی بەردەنش
بەڵێ کەردارم چون بێ کەردارەن
زاهیر هامسەیا چەنەم بێزارەن
سا چون خەجاڵەت لای هامسەرانم
زار و پەشێوحاڵ سەر هەوارانم
وە کەردەوەی وێم نیگا مەکەر پێم
خەجاڵەتیی وێم کافییەن پەرێم
هیچ خاسیی نییەن باروو وە شەفات
بار خەجاڵەت ماوەروو وە لات
ئەی خودا سا مەرگ چێشەن دەستەڵات
کێ وە خەجاڵەت یاوان وە خەڵات؟



(خالّص) یانە وێران کەر بەوێت
ئیسە چێش ماچیی دێوانەی سەرشێت؟!

***

-١٧-

(١٤٩/ف)

چمان دیارەن شادییم تۆر کەردەن
خان خەم سوپاش هێرش ئاوەردەن
فەڵەک هەم کەڵەک چەپگەردیی بەستەن
پەی کەچیی بەختم ئاواتش واستەن
موطریب بەگ ئیمشەب چەنێم بسازە
وە شەوقەکەی وێت دەمێ بنوازە
ئەر صەد بەزمەکە بیساتش جەمەن
ئاخر شیفای خەم نەوای هامدەمەن
ساقیی هامدەمیم مەعذوور بدارە
تۆیش ئەی ئیحسانە پەی وێت بکارە
بەڵکە جە نەوای شەکەر رێزەکەت
نەو صەدای شیرین شادیی خێزەکەت
فەڵەک ئەو کەڵەک بەستەی تای نەیرەنگ
لادەرۆ ئیمشەو لە ئێمەی[1] خاتر تەنگ
بەرۆش پەی کەسێ جەو حاڵ نەزانان
تا بەڵکم بەحاڵ ئێمە بزانان
(خالّص) خەمەکەت ئیمشەو خاص مەستەن
مەستیش نە هەوای (یوم الست)ەن

***

-١٨-

(١٤٩/ف)

سای سەهەند سەنگ
صوبحدەم وەشەن نەسای سەهەند سەنگ
بەڵام بەشەرتێ رەقیب بەدرەنگ

(١) لێرەدا دەبێ سووک بکرێت و وەک (لێمەی) بخوێنرێتەوە.

نەگنۆ [نە وەندت!] صەد هەزار فەرسەنگ
چەنی دۆست وێت بنشیای وە شاد
ویەردەی سالآن باوەری وە یاد
گا نیاز جە تۆ گا ناز جە دولبەر
تۆ پەی ئەو سۆزان ئەو جە تۆ بەتەر
هەر تاکە عومرت یاوا بە ئەنجام
جە سای ئەو سەنگدا بوبارای ئەییام
ئێدەن سەرمایەی ئەی دنیای فانیی
ما باقیی پووچەن هەرچێو مزانیی

***

-١٩-

(١٥٢/ف)

دیارەن ئیمشەو خەم زۆر ئاوەردەن
شای شادیم فیرار ئیختیار کەردەن
سەمتوور هەوای کەللەم سەر شارەن
ذەوقم تۆر کەردەن چارش ناچارەن
سا دەروێش بەو عەشق بارگەی شای نەجەف
بارە بدەرە کەف نە روویی دەف
چونکە دڵەکە زەلیلەن نە خەم
کزەی کەف و دەف نافیعەن جەی دەم
بەڵکەم تەسکینیی پەرێش بۆ حاصڵ
چیی نە زیاتر نە خەم نەدۆ چڵ!
جەزمەی هامسەران بەزمشان جەمەن
کۆسش گنۆ ئێد خەریک خەمەن
کەردەن وە عادەت دێوانەی پڕ نێش
بەزم عەیش وێش مشنیۆ بە وێش
نمەز هەم خەدەنگ کام نیگا لێشەن؟
جە دەست کامین خەدەنگ دڵڕێشەن؟
بەزمەکەش کەردەن وە ماتەمخانە
سازیای تەبعش موهر خومخانە
(خاڵص) با وەسبۆ بەزمەکەت جەزمەن
نە پەی خەم موخلیص وەلای تۆش عەزمەن



بەڵ پەی شادیی و ذەوق مەگیران بیسات
ئەر پەرێ خەم بۆ کێ مێۆ وە لات

***

-٢٠-

(١٥٣/ف)

ساقیی بۆ بە عیشق پیاڵە و دەستت
وە نیگای شیرین چاوەکەی مەستت
کەرەم کە جامێ وە رووی نازەوە
حەقیقی بەخشۆ وە مەجازەوە
من هەر غولآمەکەی پیری مەیخانەم
کوشتە و سووختەی جام مەستانەم
ئەر صەد موفتییان بکەران قەصتم
من مەیخوارەکەی رۆژ (أَلَستم)
بێزارم نە زوهد تەقوا پەرستان
مایلم وە دین مەیخانەی مەستان
تەنیا خاڵەکەی گۆنای یارەکەم
سەندەن جە دەستم ئیختیارەکەم
هەرکەسێ مەیلش نییەن بەو خاڵە
ئانە کافرەن دینش بەتاڵە
گێسووش سەرمایەی مایەدارانەن
سیاش رۆشنیی دڵ بێدارانەن
(خاڵص) بۆ وە فیدای نوختەی خاڵەکەش
بۆ وە پاسەبان حەوشە و ماڵەکەش

***

-٢١-

(١٥٣/ف)

من دەروێشەکەی بێ تەکیە و عەسام
بێ ئوستا و مورشید هیچ کەس نەناسام
وەعظ و فەتوازان، عەمەل نەکەردەم
[رواس پر فام پی چشە!] مەردەم

گیرۆدەی قوللەی ئەزازیلەکەم
پابەستەی زەلیل تای خەلیلەکەم
بازیی وەردەی دەست ئەممارەم
ڕابەندی شەشدەر بیەن دووچارەم
سا دەروێش دەخیل پەشیمانیمەن
ئەر صەد کە ئاخر زیندەگانیمەن
نە تەئثیر جۆش سۆز دڵەی پاک
جە قانیعی وەقت ریازەت نە خاک
هیمەتێ بەو عیشق شای دەروێشان
باوەرە پەی خاک جەستەی دڵڕێشان
بەڵ ئێمەش گیرۆ ئەو ئاە تەئثیر
کەرەم بێ شۆن ببەخشۆ تەقصیر
(خاڵص) تەقصیرش خاص بێ شومارەن
بەڵێ ئومێدش عەفو غەففارەن

***

-٢٢-

(١٥٤/ف)

دیدە کاڵانەن......
سالار سوپای دیدە کاڵانەن
نیم نیگاش قەتاڵ پەشێو حاڵانەن
یەغما کەردەی فام دڵزوخاڵانەن
خاپووری یانەی مەجنوون بەختانەن
باعیس سزای زامەت سەختانەن
نامەی فو... چەند کەسان وەندەن
باج نە شۆخەکەی ئەرمەنیی سەندەن
شێخەکەی سەنعان وە خەمگینەوە
پەی دینش نیا دەست وە دینەوە
پاسە مەعلوومەن ئێمەش چون یاران
مسپاروت وە دەست سوپای پەژاران
نیشانەی مەودای خەتەرناکەکەش
صۆفار مۆژەی دڵ پێ چاکەکەش
تا پەڕ نیشت نە جەرگ خەمان دیدەکەم



سەرکەردەن زووخاو کەس نەدیدەکەم
مەر وێش حەکیم بۆ بەر ئارۆش وە بەر
وەرنە ئەی شیفا کەفت وە رۆی مەحشەر
(خاڵص) بناڵە ناڵەت ئەثەردا
زاریکە وەی ئێش زام خەتەردا

***

-٢٣-

(١٥٥/ف)

دیسان خەیاڵت نە دەروون سەردا
نێشش نێش سۆز نار سەقەردا
قرچەش قرچەی گۆشت بریان بێزنا
بیللا هەناسەم مەحشەر خێزنا!
چون گڕەی ئەخگەر تەوەن تاوانەن
تاویای تاوش سەنگ شکاوانەن
کزەی دەروونم صەد فەرسەخ مشۆ
عەجایب ئێدەن نەیاوان وە تۆ!
چێش مبۆ جە فەیض نوور جەماڵت
یاد کەرمێ جە سای گۆشەی خەیاڵت
وە ئەنفاسی خاص مەسیح ئاساکەت
تەسکێن دەی ضەمیر وێت شناساکەت
بەڵکم کزە و سۆز ساتێ خامۆش بۆ
تا (خاڵص) تەمای مۆژدەی سەرۆش بۆ!

***

-٢٤-

(١٦٤/ف)

ئەر دۆستەکەی وێم مایل بۆ وەی کار
کەروون ئیختیار بتخانە و زوننار
هیچ باکم نییەن نە (یوم الحساب)
کێ مەگیرۆ لێم خیطاب و عیتاب؟
بەو بتخانەوۆ بەو زوننارەوە

بەو هەوای دەماغ فتوای پارەوە
مەکەرۆ سەیران تەقوا پەرستان
سەرئەفراز نە جەمع زوننارووەدەستان
ئەر بێ فتوای دۆست روو کەردەن نە خاج
حاجییان نەدین مەکەرام ئیخراج
ئەر جە دانەی خاڵ یارم مویەرۆ
فتوای دڵ نییەن نمەز چێش کەرۆ
پۆسە موینوون فتوای موفتییان
پەی فتوای یار بۆ جە رای حەق جییان
سا خاص هەر پاسەن نەحوو صەرفتان
ئیشنا عەشەر عیلم تەمام حەرفتان
ببەخشان وە تای زوڵف یارەکەم
یارەکەی عەزیز خۆش ئەتوارەکەم
بێ شەوق دانەی خاڵ عەمبەر بار
عیلمشان پووچەن نمەیۆ وە کار
(خاڵص) خەیلەنێ یارت غەمخوارەن
قازیی رۆی حەشر [یەقین!] موختارەن
........................ کەی [دڕندەی!] نەدەست
........................ رۆی (یـوم الالَـسّـت)

***

-٢٥-

(١٦٥/ف)

مەلا کولاوە... ...
مەلا زامانم جە نۆ کولاوە
دڵ وە نێش خار خەمان خەڵاوە!
طەلا وەطاڵ بی وە طەڵ طەڵاوە!
کەفتان و خێزان سەر وە دامەوە
دیم وا دیم وە بان زووخ زامەوە
قرچەش قرچەی گۆشت کەباب بێزنا
خەزانان صیفەت شەوقش ڕێزنا
دەیسان پێکیای مەودای مۆژان بی!



ژان مۆژانش ئامێتەی ژان بی
گلاراوشەن نمەبۆ ساکین
[ریزازەش تک تک و دامن خاون!]
نەی بەدبەختییە نەی وەرین دەمدا
دڵ جە زام ئاوەر نەی وەقت خەمدا
مەڵا پەی بەختم کیتاب نیگا کە
نەحسیی ستارەی (خاڵص) جیاکە
هەر یەند بەدبەختەن جەی راگوزەردا
مپێکیۆ و خێزو وە رای خەتەردا!

***

-٢٦-

(١٦٦/ف)

موطریب نە کۆنی مەر سیاسەنگی؟
من وەی حاڵەوە تۆ بەو بێدەنگیی!
با بەیۆ صەدات سەرم فیدات بۆ
ئەروام وە پێشواز گەرد پای پات بۆ
ئاخر ئەو صەلای دەوای دەردەنی
پەی ئێمە نەبۆ هەنی پەرێ کەی(!)
ساقیی مەجلیسم خاص پڕ شەفافەن
ئینتیظار وە جام وە بادەی صافەن
سا پڕکەر فنجان وەقتش زەروورەن
دڵ هەوا سەندەن دەماغش سوورەن
گا هەوای نەوای سوور خەیاڵشەن
گا تەمەنای سەیر زوڵف و خاڵشەن
هەرکەس نمەبۆ دوو کار وە یەک بار
نەئێد تەمامەن نە ئەو پایەدار
(خاڵص) ئەی دڵە تۆ کەردەن ماتەم
نە بە ئێد یاوای نە لەو خاترجەم
سا هەر بگرەوە پەرێ بەخت وێت
دڵەی کۆسکەفتە چە کارێ کەرد پێت؟!

***

-٢٧-

(١٦٦/ف)

تووتیی دومای جامپا وه دامەوه
سەر وه سەودای فیکر پوخت و خامەوه
تەعلیم ئوستای ئەزەلییش وەردەن
جەو بۆنه تەرک تەبەع جینس وێش کەردەن
منیش ئەو تووتیی پەس نمای جامم
پابەستە و سەرشار ناپوختە و خامم
تەعلیم ئوستای ئەزەلیم وەردەن
سا خیلافەن تەرک ئەو عادەت کەردەن
مەست دیدەی مەست سیاسەوادم
... فەرمای فام پیر ئوستادم
.................................. کەی خاڵ قەترانم
.................................. راز جگەر بوریانم
دۆعای ئێد کە حاڵ پشیو بیو ئاما (!)
کێ دارۆ تەما بەیۆ وه دما ؟
هیمەتەن یا دۆست شای تاج لەولاک
ماهیدەشت ماواه یەقەی ئیحسان چاک
دەستگیر ئەحواڵ پەشێوحاڵانی
ڕۆشنیی چرای دڵزوخاڵانی
مەیل کەره وەدڵ مەیلش ئیخلاصەن
هەرچەند رووسیا و پڕ ناس پاسەن
تەمەنناش وه جام ساقیی و پیاڵەن
هەواش وه شیفای سەیران خاڵەن
بۆ بە عیشق ذات تەجەللای سینا
بە ئەنوار خضر راگەی نابینا
هەرچەند رووسیای پایەی میزانم
سەر ئەفگەندە و خوار ئەحواڵ نەزانم
هیمەتێ باوەر دڵ پەنەش بۆ شاد
خەوف رۆی مەردەن باوەرۆ وەیاد
چینە زیاتر نەبۆ خەجاڵەت



.................................. زوڵم و ضەلالەت
بەڵکە جە دیوان هاهای مەحشەردا
نەسۆچیۆ جە ناو نار سەقەردا
ئەر نەوی باعیث ئەی ستاره و بەخت
(خاڵص) مولازم شەیطانەن وه جەخت

## حەسەن

لە کەشکۆڵەکەی مامۆستا ئیسماعیل سپیدارەییدا حەوت پارچە شیعر بەناوی (حەسەن)ەوە هەیە، ئیتر هیچی لەسەر نەنووسراوە و، نەنووسراوە ئەم حەسەنە کێیە، کە سەرنجی سەرچاوەکانیش دەدەین چەند حەسەن ناوێکی شاعیرمان هەن، لەوانە:

١- مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیف (حەسەن).
٢- شێخ حەسەنی دەرەهەردیی.
٣- شێخ حەسەنی مەولاناوایی.
٤- شێخ حەسەنی سازانیی.
٥- حەسەن سووتاو.
٦- حەسەن کۆر.
٧- حەسەن و ئامینە.
٨- شێخ حەسەنی کانی بی -هیجرانی-.

بەڵام کە دەگەڕێینەوە بۆلای شیعرەکان نازانین شیعری کام لەم شاعیرانەیە. ئێمەیش لەم هەلەدا ئەم شیعرانە وەک خۆیان بڵاودەکەینەوە، بەڵکو لە داهاتوودا یان شیعری دی، یان زانیاریی وا دەربکەوێ بۆمان روون ببێتەوە شیعری کێن.

دەبێ ئەوەیش بڵێینەوە کە شیعرەکان هەر ئەم نوسخەیان لە دەستدایە و ئەمیش باش ناخوێنرێتەوە.

-١-

(٥١/ف)

ڕەقیب خەستە بۆ... ...

ڕەقیب ئەندامت جە دەرد خەستە بۆ
ڕەقیب زبانت جە غەم بەستە بۆ
ڕەقیب چار ئەعزات مارانگەستە بۆ
ڕەقیب رووگەردان دەرگای داوەر بای
ڕەقیب بێ نەصیب یار و یاوەر بای
ڕەقیب حەق کارێ پەنەت بنمانۆ
ئەفلاتوون دەوای دەردت نەزانۆ
ڕەقیب جە هیجران زامت کاریی بۆ
موداوای دەردت نادیاریی بۆ
ڕەقیب تا زیندەی نەنیشی بەشاد
ڕەقیب سەرمایەی عومرت شۆ وە باد
ڕەقیب کردەی تۆ بردەی شەیتان بۆ



سەر تاپای تەنت بەکۆی زووخاڵ بۆ(!)
ڕسوای عاڵەم بای تا رۆی مەردەنت
تەوقێ جە لەعنەت شۆ نە گەردەنت
ڕەقیب دڵ شووم، دڵ جە ستەم کەیل
چەشتەن چەنی کار ئێمە و لەیل!
مەر تۆ زام عیشق دەرد نەکێشان؟
ناڵینت نەبی چەنی دڵ ئێشان!
من دەروون پڕ هوون دڵ جە سەودای لەیل
لەیل دەربارەی من خاتر کەیل مەیل
ئەی لۆنگ عوریان پەی لەیلم پۆشان
مەی بە یاد خار رەنگینم نۆشان
ئێستە مەست جام عەشق لەیل جە سەر
دڵ جە منامین نەدارۆ خەبەر
بێباکم جە تیر تانەی زەمانە
ڕاز نێک و زشت خوێش و بێگانە
بە ئیخلاص رۆحم کەردەنم [طیفل!]
خاترم زنجیر کەردەن لەیل بە مەیل
دڵ بە وەفای لەیل جام مەینۆشان
بەرگ جەفا و جەور جە هیجران پۆشان
ڕەقیب ئەر تۆ خەوف رۆی مەحشەر پێتەن
نایرەی دۆزەخ سەقەر نە رێتەن
(حەسەن) چەنی لەیل عامەن وەفاشان
تۆ پەی چێش بەی تەور مەدەی جەفاشان

***

-٢-

(٥٢/ف)

ڕەعنای شیرین خاڵ

شای شیرین ئەنداز رەعنای شیرین خاڵ
شۆخ شاپەسەند، عەین دیدەی غەزاڵ
لەیل سایەدار، قەیس غەم خەیاڵ
ئەر باوەڕداری نازدار دڵبەر

سەوگەند وە بەیزای خورشید خاوەر
هەر تا زیندەبام نەفەس یارم بۆ
هیچ حاشام نییەن جە غولامیی تۆ
سەر و ماڵ یەکسەر [طفیل!] راتەن
سورمەی بینابیم خاک پالاتەن
خەیاڵم دەردم رازم نام تۆن
جە تۆ زیاتر - گیانم - کەسم کۆن؟
شنەفتم بە راز رەقیبان سەرد
مینای خاترت زەڕە گەرتەن گەرد
یەعنی من خەیلێ ناسزام کەردەن
- دووربا - نام تۆم من وەیاد بەردەن
شیرین سەوگەندم بە ئایەی کەلام
بە سی جزمەی قورئان بەرات و ئەنعام!
بە نوور جەمال سەیید موختار
بە زات بێچوون بینای کردگار
بە رەوضەی ئەعظەم یاگەی ئومێدەن
ئەی حەرفە جە راز بەندەت بەعیدەن
چونکە شەڕ ئەندێش دایم شەڕوازەن
کارشان بەدیی پیشەش غەمازەن
صەد هەزار لەعنەت جە کارشان بۆ
جە فیعل و ئەتوار کردارشان بۆ
زەلیل و زاربان دەست بە زامەوە
نە هیجران سەخت بێ ئارامەوە
زوبانش بەند بۆ جە واتە و رازان
کۆتا کەرۆ حەرف واتەی غەممازان
شەو تا رۆ دایم بنالان جە دەرد
بە وێنەی (حەسەن) روخ جە هیجران زەرد

***

-٣-

(٥٤/ف)

میرزام دانا بۆ... ...
هەرکەسێ عارف بینا و دانا بۆ



ئەر زەڕە جە عیلم کەمال دانا بۆ
جە زەنان دوور بۆ تا تەوانا بۆ
ڕاگەی راستش وێش نەکەرۆ غەڵەط
مەیل نەدۆ بەخاڵ زەنان بێ شەرت
پەی چێش کارشان بێ مەجازییەن
ئەر مەبی فیداش لێت ناڕازییەن
زەنان ئەر چون گوڵ فیردەوس ئەعلا
بالاش هەزار تەور مەدەرۆ جەلا
چون نەقش چەنی بەناز بڕازان!
حاشا جە دیدار گشت بێ مەجازان
زڵفشان بەردەن نەدارۆ مایە
نەقد گیان پەی زەن نەکەران زایە
... شەڕەنگ شەهدشان ژارەن
ڕازشان پڕ ئێش چون گەستەی مارەن
ڕۆی ئەزەل بەشەوق عیشوە ئەندازیی
چون طیفل ساوا مەدەرۆت بازیی
بە نیمنیگای ناز ئیمای دیدەمەست
مینای خاترت مەستانۆ جە دەست
بە جادوو بە سیڕ مەکێشۆت جە بەند
بە زنجیر مەیل مەکەرۆت پابەند
تای توغرای کلاف تەذویر دڵکێش
مەوزۆت نەگەردەن بە خاترخوای وێش
توانا و تاقەت صەبرت مەستانۆ
دەرک و فام و هۆش پێت نمەمانۆ
بە دەرد هیجران مەکەرۆت خەستە
مەبی بە شاهێن شاباڵ شکەستە
سەرگەردان دەور جە غەم ماتەمین
بە وێنەی [بسمل!] خاکسار نشین
هەرگا مەعلووم بی دڵ جە تۆ سەندەن
بە تۆڕدام چاردەور خاترت تەندەن
جەو دما فکرێ حاصڵ مەکەرۆ

